# بائاسوده بين

بیلبیلەی چاوەکانم لە نوێژدایە
ڕێگایەکی کرداری بۆ نوێژێکی بە خشوع




نووسینی:
د.أحمد محمد مفلح القضاة

وەرگێڕانی:
جمال حسين بيات






**Description**

کتێبخانەیەک تایبەت بە زیاتر فێربونو کاراکردنی عەقڵ و دور کەوتنەوە لە نەزانین و ڕەشبینی.📚

هۆشیاری ڕۆشنبیری تاک لە کۆمەڵگە.
پەرەپێدانی ڕۆشنبیری تاک.
گەشەپێدانی هزری تاک.

@haval_pashaie10

ئـەکاونـــتـــەکانـــم ✔️ ⬇️

https://linktr.ee/havalpashaie

t.me/kteb_khana

Invite Link



Notifications

On



# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسّلام على المبعوث رحمة للعالمين، و على آلة وصحبه أجمعين...

زۆرێك لە پیاو چاکان وتوویانە: ئەگەر بتەوێت کەسێك بناسیت لە ڕووی باوەڕ و هەڵسوکەوتەوە، ئەوە سەیری نوێژەکەی بکە، بزانە تا چەند بە ئارام و دڵقەرارە، بە گوێرەی ئارامی و دڵقەراری لە نوێژەکەیدا ئەوەندە باوەڕ و هەڵسوکەوتی دامەزراوە.

هەروەها وتویانە ئەگەر بتەوێت خودا لەگەڵت بدوێ ئەوە قورئان بخوێنە، خۆ ئەگەر بتەوێت تۆ لەگەڵ خودا بدوێیت و گفتوگۆبکەیت ئەو نوێژ بکە.

نوێژ سەرچاوەی ئارامی دڵ و دەرونە، وە گەورەترین و بە بەهاترین خەڵاتە کە خودا بە موسڵمانانی بەخشیوە ، وەستانی باوەڕدار لە بەردەستی خودای ئەرز و ئاسمانەکان لە خۆیەوە بەخششێکی گەورەیە، وشانازیە بۆ ئێمەی بچووك ولاواز.

ئەگەر بەراورد بکەین لە نێو ملیونەها موسڵماندا چەندیان دەوەستن و نوێژدەکەن، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت لە کۆی ملیارێك و نیو موسڵمان تەنها جەند ملیونێك نوێژ دەکەن، بەڵام ئایا ئەو نوێژەیە کە خودا دەیەوێ؟! یان ئەو نوێژەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیکرد، و وسفی دەکرد؟

کاتێك ئەم فەرموودەیەم دەخوێندەوە: (وجُعلت قرة عيني في الصلاة) سەیرم لێدەهات، دەموت بۆچی ئەوەندە نوێژ کاریگەری هەبووە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئەی باشە من بۆ هەستیٚ پێناکەم؟.

پاش ماوەیەکی زۆر، جارجار هەستم بە بەزەیی پەروەردگار دەکرد، ومنەتی بەسەرمدا دەدا - دەڵێم جارجار- خشوعم دەبینی لە نوێژکەمدا و دڵم ئارام و بەختەوەر دەبوو! ئەوکات تێگەیشتم لە مەبەستی خۆشەویستمان(ﷺ) بۆچی لە کاتی نارەحەتی و لێقەومان دەهات یان توشی غەم و پەژارەیەك بووبایە هاواری بۆ نوێژ دەبرد، هەر وەکو لەو فەرموودەدا هاتووە:(إذا حزبه أمرٌ صلَّى) صححه الألباني.

پاشان کاتێك ئەم نامیلکەیەم خوێندەوە یەکەم جار بیرمکەوتەوە و زۆر دڵ خۆشبووم، هەستم دەکرد ئەم کتێبە من دەینوسم، بۆیە بڕیارمدا وەریگێڕم بۆ زمانی کوردی بەڵکو ڕۆڵی خۆی هەبێت و کەسانێکی زیاتر سوودی لێببینن، منیش خوازیارم خودای گەورە بیکاتە توێشوویەك بۆ نێو قەبر و ڕۆژی دوایم.

ئەم نامیلگەیە خاوەنەکەی دکتۆر: (أحمد محمد مفلح القضاة)ە، ناوی: (أرحنا بها، وجعلت قرة عيني في الصلاة)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای نوری حیکمەی لقی سلیمانیە، کە وەرمگێڕاوە بۆ زمانی کوردی ڕەچاوی ئەم خاڵنەم تیادا کردوە:

- ناوی کتێبەکەم ناوە : (با ئاسوودەبین... بیلبیلەی چاوەکانم لە نوێژدایە).
- هەندێك بڕگەم لابردوە و هەندێکیشم بۆ زیادکردوە، بە گوێرەی پێویستی بابەتەکە.
- بە سوپاسەوە برای بەڕێزم ماموستا هیوا محمود جاف هەستا بە پیداچوونەوەی.

داواکارم لە خوای باڵادەست پاداشتی نوسەر و لقی سلێمانی نوری حیکمە ومامۆستا هیوا بە خێر بداتەوە، هەروەها داواکارم لە پەروەردگار ئەم کارە بچووکە لە قەبارەدا و گەورە لە مانادا جێگەی ڕەزامەندی خۆی بێت، وە بیکاتە زەخیرەیەکیش بۆ پاشەڕۆژمان.

# پێشەکی نووسەر

## بسم الله الرحمن الرحيم

نوێژ پاککەرەوی دڵەکانە لە پیس و پۆخەڵی تاوان و کردنەوەی دەرگای غەیب و نهێنیەکانە.

نوێژ شوێنی پاڕانەوە و پاڵفتەکردنی تۆخمەکانە، بوارە نهێنیەکانی تێدا جێ دەبێتەوە، و نوور و ڕوناکیەکانی لێوە هەلدێت، لاوازیی تۆی مرۆڤی زانی بۆیە ژمارەی نوێژەکانی کەمکردەوە، پێویستی تۆی بۆ گەورەیی نوێژ زانی بۆیە پاداشتی نوێژەکانی بۆ زورکردی.

نوێژ گەورەترین کردەوە و بەرزترینیانە، ڕۆح و گیانی نوێژ خشوع و ملکەچیە ، نهێنیەکەشی ڕوو لە خوداکردنە بە خۆبەکەم زانین و شکانەوەی نەفس، ئەگەر نوێژێکی قبوڵکراوت دەوێت خودا بەرزیکاتەوە، و دەرگای ئاسمانی بۆ بکرێتەوە، ئەوە سوور بە لە سەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا ئەنجامیدەیت، بە تەواەی پایەکانیەوە، ڕووت لە پەروەردگارت بکە بە نزا و لالآنەوە، ئەو کاتە هەست بە بۆنی بەختەوەری دەکەیت، بۆنی گوڵاوی ئارامی و ڕازیبوون دەچێژیت،

ئەوکاتە لە نهێنی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)دەگەیت: (وجُعلتْ قُرَّةُ عَينی في الصَّلاةِ) سنن النّسائی. واتە: بیلبیلەی چاوەکانم لە نوێژدایە.

نوێژ حەسانەوەی دەروون و ئارامی بیرە، ئارامی و ڕازیبون دەڕژێنێت بە سەر ڕۆحی نوێژخوێندا بە ئەندازەی ئامادەبوونی لە بەردەستی گەورەکەیدا کە خوای باڵادەستە.

نوێژ پەیژەی سەرکەوتنی باوەڕدارە بەرەو شکو ودەسڵاتی خودای بەرز و بڵند، و ڕێڕەوی ڕۆحەکەیەتی بەرەو ئەو قیبلەی کە ڕۆحی نوێژخوێنە خاشعەکان و دڵی نوێژخوێنە لە دەوریدا بە یەك دەگەن.

لە عدی کوری حاتمەوە(رضي الله عنه)دەڵێت:(هیچ کات و ساتێکی نوێژ نەهاتووە و من شەوق وزەوقم بۆی نەبوبێت).

ئایا کەس لە ئێمە چاوەڕوانی نوێژ دەکات بە شەوق و زەوقەوە؟ و بە ئارەزووە ڕوی تێدەکات؟ وە بە ملکەچی و دڵنیاییەوە ئەنجامی دەدات؟

هیوادارم هەمومان وابین، داواکارم لە خودای گەورە ژێریمان پێببەخشێت و لە تاوانەکانمان خۆشبێت و کردەوەکانمان لێوەرگرێ، هەر خۆی پشت و پەنای باوەڕداران و چاکەکارانە.

الدكتور

أحمد محمد مفلح القضاة

# بسم الله الرحمن الرحيم

## ئەم پەیامە...

ئامانج لەم پەیامە ڕازاندنەوەی کتێبخانەکان و زیادکردنی ڕیزی نامیلکە و چاپکراوەکان نیە، بەڵکو ویستم ببێت بە پەیامێکی کرداری، وشەکانی بخوێنینەوە و لە نوێژەکانماندا جێ بەجێی بکەین تاوەکو ڕۆح بۆ نوێژەکانمان بگەڕێنینەوە، بۆ ئەوەی ببێتە نوێژێکی پڕ لە خشوعی دروستی وەرگیراو، هەر بۆیە کاری ئەم پەیامە بۆ ئەوە نیە پایە وسونەت وئادابەکانی نوێژی تیایدا ڕوون بکرێتەوە.

بەڵکو لە گەڵ هەندێك لەوانەدا ڕونکردنەوەی چۆنێتی ڕامانی نوێژ خوێنە و بیرکردنەوەیەتی کاتێك لە گەڵ خوای خۆیدا ئەدوێ و لێی ئەپاڕێتەوە.

ئەگەر ئامادەی بۆ کار و جێ بەجێکردنی ئەوا ئەم پەیامە لە لای خۆت بپارێزە، با لە نێو دەستدا بێت لە هەموو نوێژەکانتدا، و ئەگەر تەماشای دەکەیت , دواتر پشتگوێی دەخەیت و لە بیری خۆتی دەبەیتەوە، ئەوە تکات لێدەکەم ئەم نامیلکەیە بیبەخشە بە کەسێکی تر

کە سوودی لێ ببینیت، ئەوکاتە تۆش پاداشتی خۆت وەردەگریت و سوپاسکراو دەبیت.

زۆر لەوانەی کە هاتوچۆی مزگەوتەکان دەکەن، نوێژەکانیان بە پەلە و خێرا ئەنجام دەدەن، پایەکانی نوێژ جێ بەجێ ناکەن، هەروەها سونەت و ئادابەکانیشی ئەنجام نادەن، ئیتر چۆن خشوع و ملکەچی لە نوێژیاندا دەبێت؟ وە چۆن بە تەمان خودای گەورە لێیانی ورگرتبێ و پاداشتیان لەسەری بداتەوە؟ ئەوە ئەو نوێژەویە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە ئەنجامدەرەکەی فەرمووە: (ارجع فصلِّ، فإنَّكَ لم تصلِّ)صحيح البخاري.
واتە: دەفەرمویت: بگەڕێرەوە نوێژەکەت دووبارە کەرەوە، تۆ نوێژت جێ بەجێ نەکردووە!.

ئەم نامیلکەیە هەنگاوێکە هیوادارم ئاڕاستەکەی ڕاست بێت، بۆ زیندوکرنەوەی رۆحی خشوع و ملکەچی لە نوێژەکانماندا، وساباتی دلەکانمان بێت لەگەڵ پەروەردگار (جل جلاله). خودای گەورە پشت وپەنای چاکەکارانە.

إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا

النساء:١٠٣

# پێش دەسپێك

پێش ئەوەی دەست بە نوێژ بکەیت لە بیرت بێت!

ئایا تۆ ئامادەی بۆ نوێژکردن ؟

ئامادەبوون بۆ نوێژ دەبێت بە :

- پاك وخاوێنی (الطهارة).
- داپۆشینی عەورەت .
- رووکردنە قیبلە.
- کاتی نوێژ هاتبێت.

ئەمانە مەرجەکانی نوێژن دەبێت جێ بەجێ بکرێت هەرچەندە لە نار نوێژدا نین.

نوێژ گەورەترین کارە لە ژیانتدا بۆیە خۆتی بۆ ئامادە بکە.

بە ڕۆح وبەدڵ ودەرون خۆتی بۆ ئامادەبکە تا نوێژێکی بە خشوع ئەنجام بدەیت.

**پێش ئەوەی دەستکەی بە نوێژ تاوێك بیرکەرەوە و پرسیار لە خۆت بکە:**

- من لە بەردەستی کێدا دەوەستم؟!
- پرسیارێکی ترسناکە، پرسیار لە خۆت بکە وبە قوڵی بیری لێبکەرەوە!!
- ئایا ئەو سەرقاڵی و پەژارانەت لە خۆت دوورخستۆتەوە کە خشوعت لێ دەسێنێتەوە؟!

(مۆبایل، تەلەفزیۆن، ژاوەژاو، وە ئایا دەستنوێژەکەت ئەوەندە پوختە کە درێژە بە نوێژەکەت بدەیت؟)

هەندێك لە نوێژخوێنان لە نوێژ وەستاوە و ئەیەوێت خێرا تەواوی بکات ... لە بەر چی؟ چونکە ئەو کەسە:

هەست بە بەهای نوێژ ناکات لە ژیانیدا!.

ئەوە ئەرکێکە لە سەری و ئەیەوێت لە کۆڵی خۆی بکاتەوە!

**کاتێک ئامادە دەبیت بۆ نوێژ ڕوو لە قیبلە بکە،**

**بەڵام پێش دەسپێکردن بیر بکەرەوە:**

ئامادەیی نیەت زۆر گرنگە، چونکە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ و بەبێ نیەت نوێژ دانامەزرێ.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: (إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل امريء ما نوى) البخاری ، واتە: هەموو کردەوەیەك پێویستی بە نیەتە، و هەر مرۆڤێك بە گوێرەی نیەتی خۆی کارەکەی بۆ دەنوسرێ.

پاش نیەت هێنان ... وریابە تۆ ئێستا وشەیەکی زۆر گەورە وگران دەڵێیت و نوێژەکەتی پێ دەسپێدەکەیت.

**الله أكبر**

مانای (الله أكبر) چیە؟

الله لە هەموو شتێك گەورەترە، لە دونیا و سەرقاڵی کەرستەکانی گەورەترە، لە خێزانەکەت لە ماڵەکەت لە هاوڕێکانت لە بەڵێنەکانت وهەموو کارەکانت ... گەورە و مەزنترە لە هەموو شتێك، بۆیە

گوێڕایەڵی لە هەموو شتێکیتر وەبەرترە، و بەدەمەوە چونیشی گەورەترین مافە لە سەرمان.

## ئایا تۆ ڕاست دەکەیت لە وتنی (اللە أكبر)

باش بزانە، پێداویستیەکەت هەر لەلای ئەو دایە و تەنها ئەو دەتوانێت پێداویستیەکەت جێ بەجێ بکات، و ژیان ومردن ورزق وڕۆزیت بە دەستی ئەوە.

کەواتە ڕوولە ئەو بکە و دڵنیابە بۆ ئەو و ڕازیبوونی ئەو نوێژ دەکەیت.

ئێستا دەستەکانت بەرزکەرەوە بڵێ: اللە أكبر!

## کلیلی نوێژکردن

هەر بە وتنی (الله أكبر) دەچیتە نێو نوێژەوە دەبێت وەدەچیتە جیهانێکی ترەوە کە ئەویش (جیهانی نوێژە)،

بەم کارە دوو پایە و سونەتێکت ئەنجامداوە.

نیەتهێنان پایەیەکە و وتنی(الله أكبر) پایەیەکە و دەست بەرزکردنەوەش سونەتە.

بیرت بێت ... وتنی (الله أكبر)ی یەکەم هەرچی خواردن وخواردنەوە وقسە و ئاوڕ دانەوەت لێ حەرام دەکات ... تەنها دەبێت بە نوێژ و خوێندنی قورئان ونزا و یادی خوداوە خەریك بیت ... چونکە تۆ لە ناو نوێژدای ولە بەردەستی خودای گەورە دایت، قسەی لەگەڵ دەکەیت و بانگی دەکەیت و سکاڵای خەمەکانتی لەلا دەکەیت.

## پشت گوێی بخە

ئەوە دونیایە ژیانت لە ناو دەبات، ساتەکانی ژیانت بە فیڕۆ دەدات، دڵ ودەرونت پڕ دەکات لە جەنجاڵی وسەرقاڵ بوون بە کاری پڕمەینەتی قورس ونارەحەت، ئەو خەم و بەرپرسیارێتیانەی دەستەکانی کەڵەبچە کردووی. وەرە دەستەکانت بەرزکەرەوە، خۆت ئازادکە لە خەمەکانت کە ئازاری داوی، بوەستە تێرامانێك بکە و بەخۆتا بچۆرەوە، بگەڕێرەوە بۆ خودی خۆت بۆ مرۆڤە چاکە خوازەکەی نێو خودی خۆت، کە ترسی لە خودایە و بە بەرز ومەزن ڕایدەگرێت.

دەستەکانت بەرزکەرەوە و پشت لە دونیا بکە.

دەست بەرزکردنەوە لە نوێژدا یەکەم هەنگاوە بۆ پشتگوێ خستنی دونیا و جەنجاڵیەکانی، بە بەرزکردنەوەی دەستەکانت ڕوو لە خودای مەزن دەکەیت بە ڕۆح بە دڵ بە جەستەش.

وریابە کاتێك ئاماژە بە دەستەکانت دەکەیت ئەوە ئاماژەیە بە پشتگوێ خستنی دونیا، نەك بە وتنی (الله أکبر) یەکسەر بیر لە ماڵ ومنداڵ وهاورێ و بەڵێنەکان و بەرنامەکانت بکەیتەوە!.



Scanned by TapScanner

ئەمانە هەمووی دونیا بوون تۆ بە (الله أكبر) پشتت لێکرد.

ڕوو لە خوداکە وگفتوگۆی لە گەڵدا بکە، لالانەوەی بەرامبەر بکە و خەمەکانتی بۆ باسکە، دڵنیابە خودا دڵشکاو وبێ ئومێدت ناکات، وکەس پەشیمان ناکاتەوە گەر داوای لێبکات.

ئەمە یەکەم هەنگاوە بەرەو نوێژێکی بە خشوع وئاسودەبەخش، ئەمەیش بێگومان پێویستی بە ڕاهێنانە جار لە دوای جار، ئەگەر تۆ خاوەن ورە و بڕیاری بەهێز بیت کۆڵ مەدە، مەڵێ: ناتوانم، چونکە ئەو بەهەشتەی چاوەڕوانتە شایانی ئەوەیە لە پێناویداکۆشش بکەیت و خۆتی بۆ ماندووکەیت.

هەوڵ بدە بیر و تێڕامان لە گشت جوڵە و هەنگاوەکانت بکەیتەوە، بیر لە وشەکانت بکەرەوە کە دەیڵێیت.

کاتێك تەواو دەبیت لە نوێژەکەت وسەلام دەدەیتەوە، دەبینیت کارێکی زۆر گەورت ئەنجام داوە جیاواز لە جاران، لەوانەی لەسەری ڕاهاتووی.

دەبینیت هەستێکی جیاواز، کاریگەری دەبێت لەسەر هەڵسوکەوتت ژیانت بۆ باشتر دەگۆڕێت، خەریکە چێژی دڵنارامبوون و دڵنیایی و بەختەوەری دەکەیت، هەست بە نزیکبوونەوە دەکەیت لە خودای ئەرز ئاسمانەکان، ئارەزووی بەرەو خودا چوون دەکەیت !! ئەوکاتە ژیانت بەرەو گۆڕانکاری دەسپێدەکات.

ئەگەر ئەم نوێژە نوێیە گاریگەری لە ناختدا دروستکرد، ئەوە وریابە نەگەڕێیتەوە بۆ ڕێگا کۆنەکەی جاران، وەکو کەڵەشێر دەنوك لە دانەوێڵە بدات.

چێژ لە نوێژەکەت وەرگرەوە لە دڵەوە ئەم دوو وشەیە دووبارەکەرەوە:

(**نوێژەکەم ... ژیانمە**)

## نوێژ تەرازووە

کاتێك نوێژ دەکەیت بیرکەرەوە لە نوێژەکەترا بمێنێ!

بەردەوام لە بیرت بێت، (یەکەم پرسیار کەلە بەندە بکرێت نوێژەکەیەتی، ئەگەر دروست بوو ئەوە سەرجەم کردارەکانی تری دروستە، و ئەگەر نادروست بوو ئەوا سەرجەم کردارەکانی تری نادرووست دەبێت).

پاك وبێگەردی بۆ خودا! ئایا نوێژ ئەوەندە گرنگە تا ئەم ڕادیە؟!

بەڵێ بە دڵنیایەوە !

نوێژ ترازوی کردەوەکانتە، بەڵکو گرنگترین کردەوەیە بە بێ دوودڵی، گرنگترە لە بازرگانی، لە فەرمانبەری، لە پەیداکردنی ڕزق وڕۆزی، گرنگترە لە ماڵ و سامان و شمەکی دونیا، بە مردنم دونیا و ئەوەی لە دونیادا بەجێ دەمێنێت و دەگەڕێمەوە دونیایەکی تر، بەلاّم نوێژەکەم لە گەڵم دەبێت لە نێو گۆڕەکەم، و لە گەڵم دایە لە کاتی وەستانم لە بەر دەستی خودای گەورە، بۆیە پێویستە بە باشی و بە جوانی و بە تەواوی ئەنجامی بدەم.

با هەرگیز ئەم ئایەتەم لەبیر نەچێت: (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ )المؤمنون١-٢ واتە: باوەڕداران سەرفراز و سەرکەوتوو بوون، ئەوانەی نوێژەکانیان بە خشوع ئەنجامداوە.

الفلاح : واتە سەرفرازی وسەرکەوتن کە بەدی نایەت تەنها بە خشوع و ئارام بوونی دڵ لە نوێژدا نەبێت.

بۆیە ئەگەر دەتەوێت سەرفراز و سەرکەوتو بیت ئەوا نوێژێکی پڕ خشوع ئەنجام بدە.

## دیداری تایبەت

کاتێك دەچیتە نێو نوێژەوە بزانە تۆ دیدارت هەیە لەگەڵ پەروەردگاری جیهاندا، کە دەتبینێت و چاودێریت دەکات، تۆش گفتوگۆی لە گەڵدا دەکەیت، بۆیە بە دڵ بە ڕۆح بیدوێنە بە ئارامی ولاڵانەوە، و بە دەنگێکی نزم .

چیت دەوێت داوای لێبکە ، ئەو خاوەنی هەموو شتێکە، و گەنجینەی زەوی و ئاسمانی بەدەستە و رزق و چاکە و دەروی خۆشی هەر لای ئەوە.

کەس لە مرۆفەکان توانای ئەوەی نیە هەر چەندە خاوەنی ماڵ سامانێکی زۆر و گەورەش بێت؟!

خودای گەورە ڕۆژانە ڕزق وڕۆزی هەموو بوونەوەرەکان دەدات.

ئای خودایە تۆ چەندە گەورەی، چەندە بە توانای؟! گەنجینەکانی ڕۆزیت چەندە گەورەیە؟! مرۆڤەکانیش چەندە هەژار و بێ توانان؟! چەندە پێویستمان بە خودایە؟ پەروەردگار، ئێمە تۆمان باش نەناسیوە، دڵمان ئاشناکە لە نوێژەکانمان بۆ ئەوەی بە باشی بتناسین .

﴿ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ الحج:٧٤

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾ فاطر:١٥

## الله أكبر

ئێستا چویتە نێو نوێژەوە بە وتنی الله أكبر، بەمەش دوو (روکن)پایەت ئەنجامداوە(نیەت و وتنی الله أكبر)، و بەرز کردنەوەی دەستەکانتە ، پاشان دوعای دەسپێکردنی نوێژ دەخوێنیت، دەتوانی هەر دوعایەك

بخوێنیت کە لە سونەتدا هاتووە، بەڵام هەر وشەیەکت ووت باش بیری لێبکەرەوە بەبێ غەفلەت و خێرایی.

ئێستا شەیتان دێتە لات دەیەوێت لە نوێژەکەت کەمکاتەوە وخشوعت لێبسێنێت، لە پاداشتە گەورەکەی ملکەچان بێبەریت بکات، بواری پێمەدە و ئاورِ بۆ لای وەسوەسەکانی مەدەرەوە.

لەو نزایانەش کە هاتووە لە سونەتدا :

(وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ )

رواه أبو داود.

پاشان بڵێ: (اللهمَّ نقِني من خطايايَ كما يُنقى الثوب الأبيض من الدنَس، وأغسلنى من خطاياي بالماء والثلج والبرد، وباعدْ بيني وبينَ خطاياي كما باعدتَ بين المشرقِ والمغرب) (صحيح مسلم)

دەتوانیت هەر دوعایەك بخوێنیت کە لە صحیحەوە هاتووە، مەرج نیە هەموویان بخوێنیت. بەڵام بیرت لای بێت چی دەڵێیت.

ئایا تۆ لە نزاکانتدا راست دەگەیت؟ دەتەوێت خودای بەخشندە نێوان تۆ و تاوانەکانت ئەوەندەی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دوورخاتەوە؟.

کەواتە، ئێستا لە خۆتەوە دەست پێبکە، دوورکەوە لە تاوان، هەر کاتێك ویستت تاوان ئەنجامدەیت ئەوە ئەم دوعایەت بیر نەچێت، وهەڵبێ لە تاوان وەك چۆن لە دڕندەیەك هەڵدێیت کە بیەوی لەناوت بەرێت، یان مارێك بیەوێ پێتەوە بدات!!

پاش ئەم دوعایە پەنا بگرە بە خودای گەورە لە إبلیسی نەفرەت لێکراو، بلێ بە دەنگێکی نزم (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم ) چاك بیری لێبکەرەوە چی دەلێت.

أعوذ بالله: پەنا دەگرم بە خودا

الشیطان: دوژمنی تۆ و باوك و دایکت (آدم وحواء)و دوژمنی هەموو پیاوچاکانە.

الرجیم: نەفرەت لێکراو، دورخراو لە رەحمی خودا .

ئەگەر تۆ پەنا دەگری بە خوا لە ئیبلیسی بە نەفرەت لێکراو، ئەوە نەکەیی بە گوێ بکەی و وەلامی وەسوەسەکانی بدەیتەوە و فەرمانەکانی بە جێبێنی؟ ئەگەر هەوڵی وەسوەسەیدا بۆت یادی خودا بکەرەوە ڕزگات دەبێت.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ فاطر:٦

باش بزانە ئیبلیس دوژمنی باوەڕدارە، تۆش وەکو دوژمن تەماشای بکە، و نوێژ دوورت دەخاتەوە لە خرابە و گەندەڵی.

## گەورەترین سورەت

لە پاش پەنا گرتن بە خوای گەورە لە ئیبلیس، دەست دەکەیت بە خوێندنی سورەتی (فاتحە) کە خوێندنی پایەیە لە پایەکانی نوێژ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەسفی کردووە بە (أم القرآن ، السبع المثانی والقرآن العظیم)، وە پێمان دەفەرمێت: (لاصلاة لمن لم یقرأ بفاتحة

الكتاب)رواه البخاري. واتە : نوێژەکانتان وەرناگیرێت ئەگەر سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنن.

لە تایبەتمەندیەکانی ئەم سورەتە:

- گەورەترین سورەتە لە قورئانی پیرۆزدا.
- واجبە لە هەموو رکاتێك بخوێندرێت، لە نوێژی فەرز وسونەتدا. ئەوەی دەیخوێنێت وەکو ئەوەیە هەموو قورئانی خوێندبێت.
- پێی دەڵێن (الشافية ، الكافية ، الرقية)

کەواتە، گەورەترین سورەتە، و فەزڵەکانی زۆرن، و نوێژیش بە بێ خوێندنی فاتیحە لە هەموو رکاتەکاندا دروست نیە ، بۆیە سووربە لەسەر خوێندنی بە جوانی ورِەوانی.

سورەتی فاتیحە نوری خودایە پێی بەخشیوی ، دەستی پێوەو بگرە و وریابە نەیفەوتێنیت.

ئەگەر فاتیحە بە نیەتی ڕێپیشاندان بیخوێندرێت ئەوە ڕێپیشاندەر وهیدایەتە، ئەگەر بە نیەتی شیفا بخوێندرێت ئەوە شیفای تێدایە .

عن أبو سعيد المعلي، قال: كنتُ أصلي في المسجد فدعاني رسول الله (ﷺ) فلم أجبه، فقلت يارسول الله (ﷺ)، إنِّي كنتُ أصلي، فقال: ألم يقل الله : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴾ الأنفال:٢٤ ثم قال لي: (لأعلمنَّكَ أعظم سورة في القرآن قبل أن تخرج من المسجد) ، ثمَّ أخذ بيدي ، فلما أراد أن يخرجَ، قلتُ له ألم تقل لأعلمنك أعظم سورة في القرآن؟) قال: (الحمدُ لله ربِّ العالمين) الفاتحة (هي السبع المثاني والقرآن العظيم الذي أوتيته).صحيح البخاري .

واتە: أبو سعيد دەڵێت: لە مزگەوت نوێژم دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردم، وڵامم نەدایەوە پاشان وتم یارسول الله نوێژم دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا خودا نافەرموێت: "استجيبوا للهِ والرَّسولِ إذا دعاكم لما يحييكم" پاشان فەرمووی: دەبێ گەورەترین سورەتت فێرکەم لە قورئاندا پێش دەرچونت لە مزگەوت، پاشان دەستی گرتم، کە ویستی دەربچێت، پێم وت: مەگەر تۆ نەتوت گەورەترین

سورەتت فێردەکەم؟) فەرمووی: (الحمد لله ربّ العالمين) سورەتی فاتیحەیە، کە پێی دەڵێن حەوت ئایەتەکە وقورئانی مەزن.

## لە نێوان من و بەندەکەمدا

لە فەرمودەیەکی قودسیدا، خودای گەورە دەفەرمێت:

من نوێژم کردۆتە دوو بەشەوە لە نێوان خۆم وبەندەکەمدا، ئەگەر بەندەکەم بڵێت:

- (الحمد لله رب العالمين)، خودای گەورە دەفەرموێت:
- بەندەکەم سوپاسی گردم ، وەئەگەر بڵێت:
- الرحمن الرحيم، خودای گەورە دەفەرموێت:
- بەندەکەم ستایشی کردم ، وە ئەگەر بڵێت:
- مالك يوم الدين، دەفەرموێت:
- بەندەکەم بەرزی ڕاگرتم، ئەگەر بڵێت:
- إياك نعبد وإياك نستعين، دەفەرمێت:

- ئەمە لە نێوان من وبەندەکەمدایە، و داوای هەرچیم لێبکات پێی دەبەخشم، ئەگەر بەندەکەم بڵێت:

- ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ الفاتحە: ٦-٧

خودای گورە دەفەرمێت: ئەمە بۆ بەندەکەمە، و هەرچیش داوابکات.

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾ العنكبوت:٤٥

## تۆ لە وتووێژدای

ئەگەر بتەوێت لە گەڵ خودای گەورە بدوێت، ئەوە برۆ نوێژ بکە، ئەگەر بتەوێت خودا خۆی لە گەڵتا گفتوگۆ بکات، ئەوە قورئان بخوێنە، خۆ مەعلومە لە ناو نوێژدا قورئان دەخوێندرێت، هەر بۆیە لە کاتی نوێژکردندا تۆ لەگەڵ خودا قسەدەکەیت وئەویش لەگەڵ تۆ دەدوێ.

ئایا هەستت کردووە تۆ چەند بە نرخیت لەلای خودا کاتێك ئەم سورەتە دەخوێنیت لە نوێژەکەتدا؟

ئایا بیرت کردۆتەوە چەند خودا خۆشی دەوێیت و چاکەی بۆت ئەوێت؟

کاتێك دەڵێت (الحمد لله ربّ العالمين) بوەستە لە سەر ئەم ئایەتە، بە دڵت گوێبگرە لە وەڵامی خودای گەورە کە دەفەرمێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، وکاتێك دەڵێیت: (الرحمن الرحيم) کەمێك چاوەڕوانبە، بۆ ولاّمی پەروەردگار: بەندەکەم ستایشی کردم ... بەو جۆرە لە سەر هەموو ئایەتەکان بوەستە و گوێبگرە لە وەڵامەکەی، خودای گەورە یادت دەکا و ستایشت دەکات لەو نوێژە کە بەو شێوەیە ئەنجامی دەدیت.

تۆ لە گفت وگۆدای لە گەڵ خودای خۆتە، هەر وشەیەك یان ئایەتێك دەخوێنیت، خودا وەڵامت دەداتەوە.

خودای گەورە ستایشت دەکات ویادت دەکاتەوە، وەسفت دەکات بە بەندەکەم، وریابە ئەم پلە بەرزەیە لەناونەدەیت، ونەبیتە بەندەی ئیبلیسی نەفرت لێکراو.

## بیر هێنانەوە

ئەگەر دەستت بە ڕاهێنان لە سەر خوێندنی قورئان بە تێڕامانەوە کرد ئەوە وریابە ئیبلیس گاڵتەت پێ نەکات و دووبارە بتگێڕێتەوە بۆ نوێژی بە پەلە و خوێندنی قورئان بە بێ ئاگایەوە، بە دەستەواژەیەکی تر: (پارێزگاری لەسەر دەسکەوتەکانت بکە)

### لە ماناکانی دایکی قورئان

گەڕێکی تر لە گەڵ سورەتی فاتیحەدا، هەوڵ بدە لە ماناکانی ڕابمێنیت و بیر لە نیشانەکانی بکەیتەوە، لەوەیە ببێتە هۆکاری ڕزگاربوونت و پلەکانت بەرزکاتەوە.

سورەتی فاتیحە بە ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) دەست پێدەکات، ئەم وشەیە نیشانەگەلێکی گەورەی تێدایە، لەوانە، تۆ هەموو کار وگوفتار و پەرستشت بە ناوی(الله) دەست پێدەکەیت. گەورەترین

ناوێکە، ئەگەر داوای پێبکەی پێت دەبەخشێت و نزای پێبکەیت وەڵامت دەداتەوە.

پاشان تێبینی سیفەتی بەزەیی لە (الرحمن الرحیم)دا بکە و بەردەوام لە بیرت بێت: (الراحمون یرحمهم الرحمن، ارحموا من في الأرض یرحمکم من في السَّماء)رواه أبو داود،

واتە: ئەوانەی بە بەزیین خوا رەحمیان پێدەکات، ئێوە بە بەزەییبن لە نێوخۆتاندا خوداش رەحمتان پێدەکات.

## (الحمد لله ربِّ العالمین)

سوپاسی خودا دەکەین لە خۆشی وناخۆشیدا، لە هەژاری و دەوڵەمەندیدا، لە نەخۆشی و لەش ساغیدا، لە تێریتی و برسێتیدا، لە هەموو شوێن و کاتێکدا، لە پاش نان خواردن و لە گەڕانەوە لە کاردا، لە پاش ئەنجامدانی هەر پرۆژەیەکدا، سوپاس بۆ خودای گەورە،

## رب العالمین

رب: بە مانای خاوەن و سەرپەرشتیار و سەرگەورە دێت، مانای پەروەردەگار کە بەندەکانی پەروەردە دەکات بە نیعمەت وبەخشندەکانی خۆی، گەر بەخشینی خودایان لێببرێت ئەوە لە ناو دەچن.

چاودێری خودای بالادەست بۆ سەرجەم بونەوەر و دروستکراوەکانی لە دونیا، جیهانی مرۆڤ و جنۆکە ومەلائیکە و باڵندە و ئاژەڵ و مێرو و خشوك و دەریا و زەریا و وشکانی و سەرجەم دروستکراوەکان، هەمویان جیهانی خۆیان هەیە, وهەمووشیان زیکر و تەسبیحاتی خودای گەورە دەکەن.

## الرَّحمن الرَّحيم

جارێکی تر، بۆ ئەوەی هەموو جیهان (العالمین) بە سۆز و بەزەیی خودای بە ڕەحم دایانپۆشێت، چونکە سیفەتی بەزەیی(رحمه) لە پێش ولە پاشی ئەوان باس کراوە، بۆ ئەوە لە گەڵ یەکدا بە بەزیی بن، پاشان خودا لە دونیا ودوارۆژدا بە ڕەحمی خۆی دایانپۆشێت.

## مالك يوم الدين

موڵك ودەسەڵات بۆ خودای باڵادەستە لە دونیا و دوارۆژدا، بەڵام لە دونیادا هەر مرۆڤیك بانگەشەی موڵك بۆ خۆی دەکات، دەڵێت خانووەکەم، ماڵکەکەم، باخەکەم، جلەکەم، شارەکەم، وڵاتەکەم ... بەڵام کاتێك گەڕانەوە بۆ ئەو دونیا بە دەستی خاڵی، نە ماڵ نە شمەك ، نە جلوبەرگ بەڵکو ڕوت وپێی پەتین، کەسیان ناتوانێت بڵێت: ئەمە هی منە، موڵك و دەسەڵات هەر بۆ خودای تاك و تەنها و بەهێزە.

## يوم الدين

ڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوە، هەر خودا خۆی لەو ڕۆژەدا خاوەن دەسەڵاتە، سزا و پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە، پرسیار و لێکۆڵینەوە لە گەڵدا دەکات، بۆ ئەوەی مافەکان بگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکانیان، و هیچ ستەم لەو ڕۆژەدا نەمێنێت ،

لە ڕۆژی دوایدا باوەڕداران پاداشتی خۆیان وەردەگرن و دەچنە بەهەشتەوە، وبێباوەڕان وباخیبوان سزای خۆیان دەبینن و دەچنە ناو

ناگرەوە. جا کەسی ژێر ئەو کەسەیە ڕێگەی خوا بگرێت و کردەوەی چاکە بکات، هاتنە بەردەستی خودای لە بیر بێت ڕۆژی حەشر و لێپرسینەوە.

## إيَّاكَ نعبدُ وإيَّاكَ نستعين

خودایە ئێمە هەر تۆ دەپەرستین و جگە لە تۆ کەسی تر ناپەرستین، پشت و پەنامان جگە لە تۆ کەسی تر نیە، هەر تۆ پەرسراویت وشایانی پەرستنیت بە حەق، هەر تۆش پشت بێبەسراوی، هەر بۆیە ئێمە بە کۆمەڵ تۆ دەپەرستین وەکو یەك گەل، خودایە ... داوای یارمەتی و پشتیوانیت لێدەکەین. تۆش لەگەڵماندا ببە ویارمەتی دەرمان بە.

## اهدنا الصراط المستقيم

خودایە دامەزراومانکە لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆت کە دیاریت کردووە بۆمان، ئەو ڕێگایە لای ڕاستی هەواوئارەزون و لای چەپیشی ترس وتۆقاندن و هەڕەشەی بڕینی ڕزق و نەبوونی و کوشتن

ودەربەدەریە، ئەگەر تۆ دەستمان نەگریت و یارمەتیمان نەدەیت ئێمە
تیادەچین و پاڵ بە ستەمکارانەوە دەدەین.

ئێمە داوای دامەزراوی دەکەین لە سەر (صراط المستقیم) هەتا بە
دیداری تۆ شاد دەبین لە نێو بەهەشتدا .

## صراط الذين أنعمتَ عليهم

پەروەردگار تۆ دوو نیعمەتی گەورەت بە گشت بونەوەرەکان داوە،
ئەویش نیعمەتی بوون ونیعمەتی بەدەمەوەچونە، بەڵام بۆ بەندە
چاکەکانت نیعمەتی سێیەمیشت داوە ئەویش: نیعمەتی ڕێپیشاندانە،
وە هەر ئەوانەش بەختەوەرن، ئێمەش داوای ئەو نیعمەتە دەکەین بە
گەیشتن شوێنکەوتنی ڕێگاکەی ئەوان، تاوەکەو ڕزگار و بەختەوەر بین
وەکو ئەوان.

## غیر المغضوب علیهم

ئێمە ڕێگەی ئەو کەسانەمان ناوێت کە تۆ لێیان تورەیت، ئەوانیش جولەکە و هاوشێوەکانیانن، لەوانەی ڕاستیان زانیوە و ئینکاریان کردوە و دوای نەکەوتوون، خودای گەورە و تەواوی گەردون لە زەوی و ئاسمان و دار و بەرد لێیان تورەن.

## ولا الضالّین

ئەی خودا ئێمە ڕێگەی ئەوانەمان ناوێت کە گومڕابوون ئەوانەش خاچپەرستان وگاورەکان و هاوشێوەکانیانن، ئەوانەی کە بەدوای ڕاستیدا ناگەڕێن و نەیانناسیوە، بەڵکو لاسایی قەشە و گەورەکانیان دەکەنەوە و دوایان دەکەون وپیرۆزیان دەکەن بە بێ بیرکردنەوە و سەرنجدان.



Scanned by TapScanner

## ئامین

لە پاش خوێندنی ئەم ئایەتانە، دەڵێیت: ئامین واتە: خوایە گیان: وەڵاماندەرەوە و لێمانی وەرگرە، و پێمان ببەخشە ئەوەی داوامان کرد، هەموو شتێك بە دەستی تۆیە، بەڕاستی هەر تۆ خاوەن توانایت بەسەر هەموو شتەکاندا.

## اللهمَّ لك ركعت

پاشان کرنوش بەرە تا جەستەت لە جوولە دەوەستێت، پاشان بڵێ: (سبحان ربي العظيم)، سێ جار، یان پێنج یان حەوت جار، یان چەند بتەوێت زۆرتر بڵێیت، بەڵام با تاك بێت چونکە خودا تاکە و تاکی خۆشدەوێت.

لەبیرت بێت تۆ لە کورنوشدایت بۆ خودا ڕوو لە قیبلە، ئەو قیبلەیەی کە هەموو موسڵمانان بۆ نوێژ و پاڕانەوە ڕووی تێدەکەن، واتە سەرجەم موسڵمانان برا و خوشکی تۆن لە ئیسلامدا، لە نێوان تۆ و ئەواندا پەیوەندی ئاین هەیە هەرچەندە لە یەك دووربن لە ڕووی وەچە و وڵاتەوە.

ئاموژگاریت دەکەم بە وتنی ئەم نزایە هەر کاتێك کورنوش بەریت.

عن علي(رضي الله عنه) أنَّ النبي(ﷺ) إذا ركع قال: (اللهم لك ركعت .. و بك آمنت .. ولك أسلمت .. أنت ربي .. خشع لك سمعي وبصري وعظمي .. وما استقلت به قدمي لله رب العالمين) صحيح مسلم.

واتە: خودایە کورنوشم بۆ تۆ برد .. و باوەڕم بە تۆکرد.. خۆمبەدەستی تۆەدا .. تۆ پەروەردگارمیت..گوێ وبینین و گۆشت و ئێسقانم بۆ تۆ ملکەچ بوون و وەستانی پێکانیشم بۆ خودای جیهانیانە)

## سمع الله لمن حمده

کاتێك سەرت بەرز دەکەیتەوە لە کرنوش(رکوع) دەڵێیت: (سمع الله لمن حمده)، ئەگەر ئیمامەتی بکەیت یان بە تەنها نوێژ بکەیت، پاشان دەڵێیت (ربنا ولك الحمد حمداً كثيراً طيبا مباركاً فيه، ملء السماوات وملْ الأرض وملء ما بينهما وملْء ما شئت من شيء بعدَ).

رفاعەی کوری رافع الزرقی دەڵێت: ڕۆژێك لە پشتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژمان دەکرد، کاتێك سەری بەرز کردەوە لە ڕکاتەکەی فەرمووی (سمع الله لمن حمده)، پیاوێك لە پشتەوە وتی (ربنا ولك الحمد حمداً کثیراً طیباً مبارکاً فیه)، کاتێك نوێژ تەواو بوو فەرمووی: ئەوە کێ بوو قسەی کرد؟ ئەویش وتی: من بووم، فەرمووی: بینیم زیاتر لە سی فریشتە پێشبڕکێیان دەکرد لە نوسینی ئەو وتەیە.

بیرکەرەوە لەم وشە شیرینانە وبزانە وشەی (الحمد لله) یان (ربنا ولك الحمد) ترازووی قیامت پڕ دەکەن، واتە پاداشتێکی گەورەی هەیە، کەس بڕەکەی نازانێت تەنها خودای گەورە نەبێت.

## لە سەر حەوت ئێسقان

کاتێك سوجدە دەبەیت با جەستەت ڕێك وهاوسەنگ بێت، بەوەی قورسی لاشەت دابەش بێتە سەر گشت ئەندامەکانی سوجدەتدا، کە ئەمانەن: (توێل ولوتت بە یەکەوە، هەردوو ناولەپت، هەردوو ئەژنۆت، پەنجەکانی هەردوو پێت).

باش وایە نزا زۆر بکەیت لە کاتی کورنوش بردندا، چونکە ئەو شوێنە جێگای وەرگرتنی دوعایە. بیرت نەچێت کاتێك توێڵ و لووتت دەخەیتە سەر زەوی تۆ ئەوپەڕی گەورەیی بۆ خودا دەنوێنی و ئەوپەڕی بچوکی و بێ دەسلاَتیت بۆ خودا نیشان دەدەیت، ئەو کاتە دەبیتە نزیکترین کەس لە خوداوە، لەبەر ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) :(أقربُ ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء)رواه مسلم.

واتە: لە کاتی کورنوش بردندا(سجود) بەندە لە نزیکترین کات و ساتدایە لە خوای گەورەوە، بۆیە نزا زۆر بکەن.

**ئەوپەڕی بچوکی بۆ خودا دەکاتە ئەوپەڕی نزیکبوون لە خوداوە**

ئەگەر نزات لە سوجودا کرد ئەوە بزانە نزاکانت خەریکە وەردەگیرێت، و ئەوەی بتەوێ بۆت دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت: (أما السجود فاجتهدوا في الدعاء، فقَمِنٌ أن يُستجاب لكم) رواه مسلم ، واتە: لە سوجودا دوعا زۆر بکەن وا خەرێکە وەلاَم دەدرێنەوە.

بزانە کە لووت نیشانەی لوتبەرزی و ملکەچ نەبوونە، و کاتێك مرۆڤ لەخۆبایی دەبێت لووتی بەرز دەکاتەوە و مل بادەدات، بەلام ئەگەر لووتی بخاتە سەر زەوی ئەوە بچوکی و بێتوانایی خۆی بۆ خودای گەورە دەنوێنێت. ئەوەش تەنها بۆ خودایە، کاتێکیش خودای گەورە لە کرنوش و ملکەچیدا ئەتبینێت ئەوا بە سۆز و بەخشینەوە ڕوت تێدەکات.

پەلە مەکە لە کورنوشبردن(سجود)دا، درێژەی پێبدە چەندە دەتوانیت. و داوای هەرچی خێری دونیا و دوارۆژدا بکە، لەو دوعایانە کە لە پێغەمبەر(ﷺ)هاتووە.

لەو نزایانە: (اللهمَّ لكَ سجدتُ وبكَ آمنتُ ولكَ أسلمتُ، سجدَ وجهي للذي خلقهُ وصورهُ وشقَّ سمعهُ وبصرهُ، تباركَ اللهُ أحسنُ الخالقين) رواه مسلم.

(اللهمَّ اغفرْ لي ذنبي كلَّهُ ، دقَّهُ وجلَّهُ، أولهُ وآخرهُ وعلانيتهُ وسرَّهُ) رواه مسلم. (سبوحٌ قدوسٌ ربُّ الملائكةِ والرَّوح) رواه مسلم

## لە بەخشینەکانی سجود (فضائل السُجود)

- پلەت بەرز دەبێتەوە.
- لێخۆشبوون لە تاوان.
- وەرگرتنی دوعا.
- نزیکبوونەوە لە خودا.

عن ثوبان مولى رسول الله (ﷺ) قال: قال رسولُ الله (ﷺ) (عليك بكثرة السجود، فإنَّكَ لاتسجدُ لله سجدةً إلاَّ رفعكَ الله بها درجة، وحطَّ عنك بها خطيئة) رواه مسلم

واتە: لە (ثوبان)ەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سوجدە زۆر ببە بۆ خودای گەورە، چونکە تۆ بە هەر سوجدەیەك پلەیەك بەرز دەبیتەوە و تاوانێکت لەسەر دەسڕێتەوە).

عن ربيعة بن كعب الأسلمي، قال (كنتُ أبيتُ معَ رسول الله "ﷺ" فأتيته بوضوئه وحاجته، فقال لي:"سَلْ" فقلتُ: أسألُك مرافقتك في الجنَّة، قالَ: "أوَ غيرُ ذلك؟" قلتُ: هو ذاك، قال: "فأعنِّي على نفسكَ بكثرة السُجود" رواه مسلم .

واتە: لە ربیعەی کوری کعب الأسلمی (خودا لێی ڕازیبێت) وتی: من لە گەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) شەو دەمامەوە، پێداویستیەکانی و ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادە کرد، فەرمووی: داوام لێبکە، وتم: داوای هاوڕێیەتی بەهەشتت لێدەکەم، فەرمووی: جگە لەمە داوایەکی ترم لێبکە، وتم: تەنها ئەمەیە، فەرمووی: باشە یارمەتیم بدە بە زۆر سوجدە بردنت بۆ خوای گەورە.

### تذلل وانكسار (شکانەوە و خۆبەکەم زانین)

لە سجودا لە خودا بپاڕێرەوە و بڵێ:

- (یارب! أنا عبدك الفقير الضعيف المسكين، وأنت الله القوي العزيز). پەروەردگار! منم بەندەی هەژار و لاواز وبێکەس تۆیش خودای دەوڵەمەند وبە توانایت.

- (یارب! أغنني بالإفتقار إليك، ولا تفقرني بالإستغناء عنك)

پەروەردگار: دەوڵەمەندمکە بە هەژاریم بۆ لای تۆ، هەژارم مەکە بە بێنیازیم لە تۆ.

- (یارب، إعزني بالتذلل بين يديك، ولاتذلني بالوقوف على باب أحدٍ غيرك).

پەروەردگار! سەربەرزمکە بە ملکەچیم لە بەر دەستی تۆ، ملکەچ و سەرشۆڕم مەکە بە وەستانم لە بەر دەرگای غەیری تۆدا.

- (يارب لك عبيد كثيرون غيري، وليس لس رب سواك)

پەروەردگار ! تۆ بەندەت زۆرە جگە لە من، بەڵام منی بێکەس جگە لە تۆ هیچ پەروەردگارێکم نیە!

- (يارب: إن طردتني عن بابك فأين أذهب؟ وأين أتوجه؟)

پەروەردگار! ئەگەر لە دەرگاری ڕەحمی خۆت دەرمکەیت بۆ کوێ بڕۆم؟ ڕوو لە کوێ بکەم؟

کاتێك لە نوێژدا گفتوگۆ دەکەیت لە گەڵ پەروەردگاری خۆتدا وریا بە وئامادەبە بە دڵ وڕۆحت، بەڵکو ڕەحم وبەزەیی خودا داتپۆشێت، و بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بیت. دەتوانی هەریەك لەم نزایانە بکەت.

- (یارب، إعزني بالتذلل بين يديك، ولاتذلني بالوقوف على باب أحدٍ غيرك).

پەروەردگار! سەربەرزمکە بە ملکەچیم لە بەر دەستی تۆ، ملکەچ و سەرشۆڕم مەکە بە وەستانم لە بەر دەرگای غەیری تۆدا.

- (يارب لك عبيد كثيرون غيري، وليس لس رب سواك)

پەروەردگار ! تۆ بەندەت زۆرە جگە لە من، بەڵام منی بێکەس جگە لە تۆ هیچ پەروەردگارێکم نیە!

- (يارب: إن طردتني عن بابك فأين أذهب؟ وأين أتوجه؟)

پەروەردگار! ئەگەر لە دەرگاری ڕەحمی خۆت دەرمکەیت بۆ کوێ بڕۆم؟ ڕوو لە کوێ بکەم؟

کاتێك لە نوێژدا گفتوگۆ دەکەیت لە گەڵ پەروەردگاری خۆتدا وریا بە وئامادەبە بە دڵ ورۆحت، بەڵکو ڕەحم وبەزەیی خودا داتپۆشێت، و بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بیت. دەتوانی هەریەك لەم نزایانە بکەت.

تۆ خودا  بە گەورە و پیرۆز ڕادەگریت، وریابە لەو کاتە دڵت بێ ئاگا نەبێت.

## التحيات لله

لە دانیشتن بۆ (تحيات) دەڵێیت: التحيات لله والصلوات والطيبات ....

التحيات لله، واتە: ستایش و ڕێزلێنان بۆ خودای گەورە، ناوترێت: سلام لە خودا، چونکە خودا خۆی ناوی سەلامە، بەڵام گەورە ڕاگرتن ئەوەیە لە نوێژدا ستایشی بکەین و بڵێین : التحيات لله والصلوات والطيبات.

ئەگەر ئەم وشانە بڵێیت ئەوە تۆ خودات بە گەورە ومەزن ڕاگرتووە، و ستایشی دەکەیت، وریابە بێئاگا نەبیت لەو کاتانە.

لە نوێژەکەتدا با دڵ و ڕۆح و ناخت ئامادەبێت، ڕوو لە خودا بکە وەکو کەسێکی ئاتاج و لێقەوماو ئەویش ڕووت تێدەکات بە بەزەیی و بەخشندەیی خۆیەوە.

## السلام عليك أيّها النبيّ

پاش وتنی: التحيات لله والصلوات والطيبات،

دەڵێیت: السلام عليك أيّها النبيّ ورحمة الله وبركاته.

بیرت نەچێت چون خودای گەورە ڕێزی لێگرتیت!

تۆ ئێستا لەبەر دەستی پێغەمبەردای(ﷺ) ئەیدوێنی وسەلامی لێدەکەیت ڕاستەوخۆ.

ئەگەر لە ڕۆژهەڵاتی زەوی یان لە ڕۆژئاوادا بیت، لە هەرکوێدا بیت لە دونیا، لە نوێژەکەت ڕاستەوخۆ ڕۆحت و ناخت دەگوێزرێتەوە سنووری شوێن وکات دەبڕێت، وا دەزانیت کە لە بەردەستی پێغەمبەردای (ﷺ) و دەڵێیت: السلام عليك أيُّها النّبي ورحمه الله وبركاته!

نوێژی بە دڵ و خشوع وات لێدەکات وەکو ئەوەی بفڕی و لە نێو شاری خۆشەویست دابەزیت و سەلام لە خۆشەویستی خودا و گەورەی مرۆڤایەتی بکەی. پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی سەلامەکەت بە جوانتر

دەداتەوە، ئەو گوێی لە سەلامەکەتە، ئاسوودە دەبێ بە کردەوە چاکەکەت،

عن أوس بن أوس(رضي الله عنه)، قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "إنَّ من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فيه خُلِق آدم، وفيه قبض، وفيه النفخة، وفيه الصَّعقة، فأكثروا عليَّ من الصلاةَ فيه، فإنَّ صلاتكم معروضة، قالوا: يارسول الله، وكيف تُعرض صلاتنا عليكَ وقد أرمتَ (بليت)، فقال: إنَّ الله عزَّوجل حرَّمَ على الأرضِ أجساد الأنبياء" سنن أبى داود

واتە (باشترین ڕۆژتان ڕوژی هەینیە، تیایدا ئادەم دروستکراوە، هەر لەو ڕۆژەدا مردووە و لەهەیندا فوی یەکەم و دووەم ڕوو دەدات، جا کەوایە زۆر صەلەواتم لەسەر بدەن لەو ڕۆژەدا، چونکە صەلەواتەکەتان پێم دەگات، وتیان یارسول الله چۆن پێت دەگات کە ئەو کاتە تۆ لە خاکدا ڕزیوی؟ فەرمووی: خودای گەورە جەستەی پێغەمبەرانی لە سەر زەوی حەرام کردووە لەناو بچێت).

## السلام علینا وعلى عباد الله الصالحين

کێن (عباد الله الصالحون)؟ و ژمارەیان چەندە؟ ئایا پێشتر بیرت لەمە کردۆتەوە؟

کاتێك دەڵێیت: (السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين)، ئەوە باش بزانە سەلامی تۆ دەگاتە هەموو چاکەکاران (صالحين) لە مرۆڤ و جنۆکە و مەلائیکەش، ئەوانیش بە هەمان شێوە سەلامیان دەگاتە ئێمە، جا بزانە ڕۆژانە چەندە چاکەت پێدەگات؟!

هەر بۆیە دەبێت پرسیار لە خۆت بکەیت و بیرکەیتەوە: ئایا تۆ لە چاکەکارانی(صالحين)؟ ئایا سەلامی چاکەکارانم پێدەگات؟ ئەگەر تۆ لە چاکەکاران بیت ئەوە بزانە هەر ڕۆژێك لە هەر نوێژێکدا و بە ژمارەی نوێژە فەرزەکان و سونەتەکانیشەوە لە لایەن نوێژخوێنان ئەوندە سەلامت پێدەگات.

کەواتە لە شەو وڕۆژێکدا ملیونها سەلامت پێدەکات، هەروەها سەلامی تۆش دەگاتە هەریەك لە چاکەکاران لە بەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): (إذا صلى أحدكم، فليقل: التحيات لله والصلوات

والطيبات، السَّلامُ عليك أيُّها النَّبيُّ ورحمةُ الله وبركاته، السَّلام علينا وعلى عباد اللهِ الصّالحين، فإنَّكم إذا قُلتموها أصابت كلَّ عبدٍ لله صالحٍ في السَّماءِ والأرضِ" رواه البخاري

واتە: پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێت: (ئەگەر هەریەك لە ئێوە نوێژی کرد، با بڵێت: صەلەوات و پاکژی و شکومەندی بۆ خودای گەورە، سەلامی ئێمە و ڕەحمەت و بەزەیی خودای گەورەت لێبێت ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، سەلام لە خۆمان و بەندە چاکەکانی خودای گەورە، ئێوە ئەگەر ئەمە بڵێن ئەوە سەلامتان دەگاتە گشت بەندەیەکی (صالح)چاکەکاری خودای گەورە لە ئاسمان و زەویدا).

لە لایەکی ترەوە، دەبێت باش بزانین کە بەندەی چاکەکار ئەو بەندەیە کە:

- حەرام ناخوات.
- ستەم لەکەس ناکات.

ئەم شایەتیدانە بەڵگەیە لەسەر ئەو پەڕی باوەڕ و باوەڕهێنان، جا دەبێت دەستی پێوە بگریت ولە ناوی نەدەیت، زیاتر لە دەستە و داوێنی منالّی شیرەخۆر بە دایکیەوە.

ئەم شایەتیدانە کلیلی بەهەشتە، و بەبی ئەم کلیلە دەرگای بەهەشت ناکرێتەوە، شایەتومان باشترین ویرد و رزگارکەرە لە ئاگری دۆزەخ، بێباوەڕانیش لە ڕۆژی دواییدا ئاواتەخواز ئەبن ئەم وشەیانە هەبوایە لە دونیا (لاإله إلاّ الله)

ڕۆژێك دێت باوەڕداران دەچنە بەهەشتەوە و بێباوەڕان و ستەمکارانیش دەچنە دۆزەخەوە، و باش دەزانن کە ئەمە ڕاست و ڕەوایە لە لایەن خودای گەورەوە.

دەوترێت: باوەڕداران دەچنە بەهەشتەوە بە ڕەحم وچاکەی خودای گەورەوە، و کافر و بێباوەڕانیش دەخرێنە ئاگرەوە، لەگەڵ زۆر لە یاخیبوان و سەرپێچکارانی موسلمانان ئەوانەی کە و تەوبەیان نەکردبوو دەخرێنە ئاگرەوە، هەر خودا خۆی دەزانێت چەند دەمێننەوە لە ناو دۆزخ، پاشان دەردەکرێن لە ئاگر، کافرەکان کە نایان بیننەوە

دەڵێن: ئەوە فلان کەس کە لەگەڵماندا ئەشکەنجە دەدرا لە ناو ئاگر بۆ کوێ چوو؟ پێیان دەڵێن: شەفاعەتی بەرکەوت و دەرچوو لە نێو دۆزەخ، ئەوانیش دەڵێن: بە چی شەفاعەتی بەرکەوت؟ پێیان دەڵێن: چونکە ئەو لە یەکتاپرستان بوو، دەیگوت (لاإله إلاّ الله)... پاشان ئاوات دخوازت کە ئەوانیش ئەم وشەیانە بگوتایە لە دونیادا تاوەکو شەفاعەتیان بەرکەوتایە، پاشان پەشیمانیان زیاتر دەبێت کاتێک دەزانن شەفاعەتی شەفاعەتکاران بەر ئەوان ناکەوێت و نایانگرێتەوە.

(فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ) المدپر:٤٨

( رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ )الحجر:٢

بۆ ئەوەی لە چاکە و سوودی ئەم وشە گەورەیە تێبگەین، وشەی یەکتاپەرستی، با فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) بخوێنینەوە: (قال موسی: یارب، علمني شيئاً أذكرك وأدعوك به، قال: قل يا موسی: لاإله إلاّ الله، قال: یارب كلُّ عبادك يقولون هذا، قال: یاموسی، لو أنَّ السّماوات السّبع وعامرَهُنَّ غيري، والأرضين السّبعَ في كفِّهِ، ولا إله

إلاَّ الله في كفَّةٍ، مالت بهنَّ لا إله إلاَّ الله)رواه ابن حبان والحاكم وصححه .

واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرێت (پێغەمبەر موسی فەرمویەتی: پەروەردگار، شتێکم فێرکە یاد وداوای پێبکەم، فەرمووی: موسی بڵێ: لاإله إلاَّ الله، فەرمووی: پەروەردگار هەموو بەندەکانت ئەمە دەڵێن. فەرمووی ئەی موسا ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان وئەوەی تیایاندایە جگە لە من، لەگەڵ حەوت بەشەکانی زەویدا بخرێنە تای تەرازویەکەوە و "لا إله إلاَّ الله" لە تایەکەی تری تەرازوەکە دابنرێت ئەوە "لا إله إلاَّ الله" قورستر دبێت).

| |
|---|
| فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ |

# كما صليت على إبراهيم

(اللهم صلِّ على محمَّد وعلى آل محمّد، كما صلّيت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، وبارك على محمّد وعلى آل محمّد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين، إنّك حميد مجيد) رواه الترمذي.

واتە: خودایە صەلەوات بدە بە سەر محمد و خاوخێزانیدا، هەرچۆن صەلەواتت بە سەر ابراهیم و خاوخێزانیدا دابوو، خودایە بەرەکەت و فەڕ برژێنە سەر محمد و خاوخێزانیدا، وەك چۆن بەرەکەتت ڕژاندووەتە سەر ابراهیم خاوخێزانیێدا لە تەواى جیهانەکاندا، بەڕاستی تۆ سوپاسکراو وشکۆمەندیت.

بیرکەرەوە لەم شێوازە دەربڕینە لە صەلەواتدان بە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، کە ئەمەیان باشترین شێوازە کە هاتووە، وگەورەترین پاداشتی هەیە، و هەر کاتێك یەك صەلەوات بخوێنی لە سەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا خودای گەورە دە جار صەلەواتت لە سەر دەدات. خۆ ئەگەر تۆ لە شەو ورۆژێکدا سەد جار صەلەواتت خوێند ئەوە خودای گەورە هەزار جار صەلەواتت لە سەر دەدات.

ئاخۆ لە پاش هەزار جار صەلەوات دان لە لایەن خوداوە لە سەر تۆی بچوکدا، ئەکرێت ئەشکەنجەت بدات؟

بیرکەرەوە لەو قسەیەت: هەر چون صەلەواتت داوە بە سەر ابراهیم و خانەوادەکەی!

بۆچی تەنها ئیبراهیم جگە لە ئەو هەموو پێغەمبەرانە سەلامی خودایان لە سەر بێت؟

چونکە ئیبراهیم تایبەتمەنی خۆی هەیە:

یەکەم : ابراهیم لە باوانی پێغەمبەرمانە محمد(ﷺ) .

دووەم : ابراهیم کەعبەی دوروست کردووە و پایەکانی بەرز کردۆتەوە و لە بت و هاوبەشدانان پاکی کردۆتەوە.

سێیەم : زۆر لە دروشمەکانی ئاینەکەمان پەیوەستن بە ابراهیمەوە(علیه السلام)، وەکو: قیبلە و پایەکانی حەج و قوربانی.

چوارەم : ابراهیم شکێنەری بتەکانە هەر وەها محمد(ﷺ).

پێنجەم : پێغەمبەرمان محمد و ئیبراهیم (سەلامی خودایان لە سەر بێت) بەیەك گەیشتن لە شەوی ئیسرا و میعراجدا، سەلامی لێکرد و فەرمووی بەخێر بێیت ئەی کوڕی چاکەکار و پێغەمبەری چاکەکار. پاشان وەسیەتێکی بۆ کرد، فەرمووی: ئەی محمد سەلامی من بگەیەنە گەلەکەت، و هەواڵیان پێبدە کە بەهەشت خاکەکەی پاك و جوانە، ئاوەکەی شیرینە، دەشتی سەوزی زۆر و فرەوانە، نەمامەکانی (سبحان الله و الحمد لله و لا إله إلاّ الله، و الله أكبر)ە .

## ئەی گەلی موسلمان

ئەی گەلی موسلمان: باوکتان ئیبراهیمە، خۆشەویستی خودایە، سەلامتان پێدەگەیەنێت، داواتان لێدەکات بۆ ئەوەی پشکی خۆتان لە بەهەشت بچێنن، بە وتنی:(سبحان الله، والحمد لله، و لا إله إلاّ الله، و الله أكبر)

## کۆتایی نوێژ سەلامە

پێش دەرچونت لە نوێژ، لە بیرت نەچێت بە داواکردنی ئەم چوار شتە کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای پێدەکردن و جەختی لە سەر دەکردەوە:

اللهم إنِّي أعوذ بكَ من عذاب جهنَّم.

وأعوذُ بك من عذاب القبر.

وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات.

وأعوذ بك من شرِّ فتنة المسيح الدّجال. (صحيح مسلم)

واتە: خوایە گیان من پەنات پێدەگرم لە ئەشکەنجەدانی دۆزخ، پەنات پێدەگرم لە ئەشکەنجەدانی ناو گۆڕ، پەنات پێدەگرم لە فیتنەی زیدوبوونەوە ومردن، و پەنات پێدەگرم لە شەڕی فیتنەی مەسیحی دەجال.

پاشان بڵێ: السلم عليكم ورحمه الله، بە لاکردنەوەت بۆ لای ڕاست و لای چەپیش، بەمە تۆ لە جیهانی نوێژ دەرچووی بۆ ئەوەی دیسان بگەڕێیتەوە بۆ جیهانی ئەم دونیایە!

بەڵام لە بیرت نەچێت: تۆ ئێستا دابەزیت بۆ جیهانی دونیا، بە وتنی: السلام علیکم ورحمه الله، واتە: ئەی خەڵکینە، ئەی تەواو بونەوەرەکان من بە سەلام (ئاشتی) هاتووم بۆ لاتان، پەیمانتان پێدەدەم کە لە خراپەی من پارێزراوبن وە لە منەوە هیچ ئازار و خراپەیەکتان پێنەگات، چونکە من موسڵمانم، موسڵمانیش رەحمەت و بەزەییە بۆ هەموو جیهانیان.

## برای موسڵمانم

❖ ئەگەر نوێژت کرد بیرکەرەوە و تێڕامانت هەبێ ... پەلەیش مەکە ... پێداویستیەکەت بە دەستی ئەو خودایەیە کە لە نوێژەکەتدا لە بەردەستیدا وەستاویت، لە توانای ئەودایە پێداویستیەکەت بۆ جێ بەجێ بکات، خەمەکەت بڕەوێنێتەوە، لە تاوانت خۆشبێت، و هەر داواکەیت هەبێت پێت بدات.

❖ نوێژ بۆ خودا بکە، و ملکەچ و ئارامبە لە نوێژەکەتدا، بەردەوام لە گەڵ ئەو کەسانەدا ببە کە زۆر یادی خودا دەکن.

والحمد لله رب العالمین

چاپی یەکەم

# بائاسودە بین

بیلبیلەی چاوەکانم لە نوێژدایە
ڕێگایەکی کرداری بۆ نوێژێکی بە خشوع



نووسینی:
د.أحمد محمد مفلح القضاة

وەرگێرانی:
جمال حسین بیان

٢٠٢٠